زنجیرەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە (١)

# بیروباوەڕی ڕاستەقینە و دژەکانی

نووسینی
الشیخ عبدالعزیز ابن باز

چاپی سێیەم

وەرگێڕانی
مامۆستا خەلیل ئەحمەد

زنجیرەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە
(١)

# بیروباوەڕی ڕاستەقینە
# و
# دژەکانی


نووسینی
الشيخ عبد العزيز بن عبد الله بن باز

وەرگێڕانی
مامۆستا : خليل أحمد



کتێبخانەی
زانستی بەسوود

چاپی چوارەم
١٤٢٣ ك

ناوی کتێب : **بیروباوەڕی ڕاستەقینە و دژەکانی .**
ناوی نووسەر : **الشيخ عبد العزيز بن عبد الله بن باز .**
ناوی وەرگێڕ : **مامۆستا خلیل أحمد .**
ژمارەی سپاردن : **ژمارە ( ٥١٠ )ی ساڵی ( ١٩٩٩ ) پێ دراوە لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری حوکومەتی هەرێمی کوردستانەوە .**
زنجیرە : **زنجیرەی ( ١ ) یەکەم لە زنجیرەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە .**
نۆرە و ساڵی چاپ : **چاپی چوارەم / ١٤٣٣ ك ـ ٢٠١٢ .**
چاپخانە : **چاپەمەنی زانا .**
بنکەی بڵاوکردنەوە :

**کتێبخانەی سوننە ــ سلێمانی .**
**کتێبخانەی پێشین ــ هەولێر .**
**کتێبخانەی زانستی بەسوود ــ کەلار .**
**کتێبخانەی دێرین ــ سۆران .**
**کتێبخانەی سیما ــ چەمچەماڵ .**

**لە بڵاوکراوەکانی**
**کتێبخانەی زانستی بەسوود / کەلار**

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی وەرگێڕ :

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِن سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ [آل عمران]

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ [النساء] .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ [الأحزاب] .

أَمَّا بَعْدُ : فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيْثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُوْرِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ

**خوێنەری خۆشەویست ، ماوەیەکی زۆرە بە تەمام خزمەتێك لە بواری بیروباوەڕی ئیسلامیدا بکەم ، بە تایبەت بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئەهلی سوننە ، چونکە بە ڕاستی**

بیروباوەڕ وەکو سەر وایە بۆ لاشە ئەگەر نەبێت ئەویش هیچ نرخێکی نابێت

لای هەموو کەسێکی خاوەن فام و ژیری ئاشکرایە کە بیروباوەڕ لە ژیانی موسڵماناندا چ ڕۆڵ و بەهایەکی هەیە ، لە کاتێکدا بنچینەی یەکەم لە بانگەوازی هەموو پێغەمبەران لە ( **نوح** )ەوە تا ( **محمد** ) ـ سڵاوی خوایان لە سەر بێت ـ بریتی بووە لە یەکخواپەرستی و ڕاستکردنەوەی بیروباوەڕ ، ئەمە مەبەستی یەکەم بووە لە بانگەوازەکەیان ، کە دەبێتە مایەی چاکبوونی دونیا و ڕۆژی دوایی خەڵك ، چونکە ئەگەر بیروباوەڕیان ڕاستەقینە بێت ئەو کاتە هەموویان مل کەچ و گوێ ڕایەڵی خوا دەبن ، و دەست بە پەیامەکەیەوە دەگرن و بەم هۆیەوە ژیانی دونیا و ڕۆژی دواییان خۆش دەبێت .

کەوابوو هەر گوفتار و کردار و بانگەوازێ لە سەر ئەم بنچینەیە بنیات نەنرێ ئەوا بانگەوازەکە خاڵی نی یە لە کەموکوڕی ، وە مەترسی ئەوەی لێ دەکرێت کە ئاکام و سەرئەنجامی نەمان و لە ناوچوون بێت ، یان لادان و گومڕابوون لە ڕاستە شەقامی ئیسلام ( **الصراط المستقيم** ) ، یان هەردووکیان

پێکەوە ، چونکە ئەمە بنچینەیەکی گەورەیە لە بنچینەکانی ئاینی ئیسلام ، هەرکاتێك خەڵکی لە هەر سەردەمێکا لێی بێ ئاگا بوون کەوتوونەتە هەڵدێری شیرك و بیدعەوە

لە بەر هەموو ئەمانە بەئەرکی سەرشانی خۆمم زانی کە هەرچیم لە توانادایە بیخەمە گەڕ بۆ ئاشناکردنی موسڵمانان بەم ڕاستییە ، جا دەستم کرد بە ڕێکخستنی ئەم پڕۆژەیە و ناوم لێنا ( **زنجیرەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە** ) ، کە بریتییە لە وەرگێڕان و شەرح و لێدانەوەی ژمارەیەك کتێبی بە سوود دەربارەی بیروباوەڕی ئەهلی سونە و جەماعە لە نووسینی زانایانی هەمان کۆمەڵ ئەو کتێبانەش بریتین لە

**1 ـ بیروباوەڕی ڕاستەقینە و دژەکانی 000 نووسینی / شێخ ابن باز 000 وەرگێڕان .**

**2 ـ یەکخوا پەرستی 000 نووسینی / شێخ محمد عبدالوهاب 000 شەرح**

**3 ـ نەهێشتنی گومان 000 نووسینی / شێخ محمد عبدالوهاب 000 وەرگێران و لێکدانەوە .**

**4 ـ عەقیدەی واسطی 000 نووسینی / شێخی ئیسلام ابن تیمیة 000 شەرح و وەرگێڕان .**

5 ـ عەقیدەی طحاویة 000 نووسینی / الطحاوي 000 شەرح

6 ـ الإبانة عن أصول الديانـة 000 نووسـينی / أبـو الحـسن الأشعري .

جا خوایە داوات لێ دەکەم یارمەتیم بدەیت بۆ تـەواو کردنـی ئەم پرۆژەیە و لە هەڵە و لادان بمپارێزی و نیـەتم پـاك بکەیتـەوە بۆ ئەوەی تـەنها مەبەسـتم لـەم کارەمـدا تـەنها تـۆ بـێ ، پاشـان سوودی بۆ هەموو موسڵمانان هەبێ ، وە لە بـەر گـەورەیی خـۆت بەرەکەت و فەڕ بخەیتە ئەم کـارەوە ، خوایـە ئەگـەر لـە شـتێکدا ڕاستم کردبێت و پێکا بێتم ئەوا یارمەتی تۆیـە ، وە هـەر تـاوان و هەڵەیەکم کردبێت ئەوە لە خۆم و شەیتانەوەیە .

لە شەوی چوار شەمە پاك نووسکرا

لە بەرواری 29 ذي القعدة 1419 ك

بەرامبەر 17 ی ئازاری 1999 م

لە کەلار

مامۆستا : خليل أحمد

ژمارەی مۆبایل : ( 07701580522 )



سوپاس و ستایش بۆ خوا ، درود و سڵاو بۆ سەر گیانی پێغەمبەر ﷺ و کەس و کار و هاوەڵانی بە گشتی .

پاش ئەوە : لە بەر ئەوەی بیروباوەڕی ڕاستەقینە بریتیە لە بنچینە و بنەمای ئاین و شەریعەتی ئیسلام ، بە چاکم زانی بابەتی ووتارەکەم ئەوە بێ و دەربارەی ئەو ڕاستیەیە بدوێم ، وە لای هەموو کەس ئاشکرایە بە بەڵگەی شەرعی لە قورئان و سوننەت کە گوفتار و کردار کاتێ وەردەگیرێ ئەگەر لە بیروباوەڕێکی ڕاستەقینەوە دەرچووبێ ، ئەگەر نا ئەوا هەموو ئەو لقانەی لێی دەبنەوە لە وتە و کردەوە بەتاڵ دەبنەوە و وەرناگیرێن ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ۝٥﴾ [المائدة : 5]

واتە : هەر کەس لە باتی باوەڕهێنـان ، ئینکار و کوفر بکات ، کار و کردەوەکەی باتڵ و بێ‌شوێنە و لەو دوارۆژیشدا لە خەسارەتمەندانە .

وە دەفـەرموێ : ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾﴾ [الزمر]

واتە : بە حەقیقەت بۆ تۆ و بۆ پێغەمبەرانی بەر لە تۆش وەحی نێردراوە ، ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی کردەوەت بەتاڵ دەبێ و لە خەسارەتمەندان دەبی .

وە چەندین ئایەتی تر لەم ڕووەوە هاتوون .

قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەن کە بیروباوەڕی ڕستەقینە بە کورتی : بریتی‌یە لە باوەڕبوون بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و باوەڕ بوون بە قەدەری چاك و خراپ .

ئەم شەش بنچینەیە بنچینەی ئەو بیروباوەڕە ڕاستەقینەیەن کە قورئانی پیرۆز پێی دابەزیوە و خوا پێغەمبەری پێ ناردووە ﷺ

هەموو ئەوانەی کە پێویستە باوەڕیان پێ بهێنرێ لە شتە نادیارەکان و ئەوانەی خوا و پێغەمبەر هەواڵیان پێ داوین دەگەڕێنەوە سەر ئەم شەش بنچینەیە و لێرەوە سەرچاوە دەگرن ، **بەڵگەی ئەم شەش بنچینەیەش لە قورئان و سونەت دا گەلێ زۆرن ، لەوانە :**

ئایەتی: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ ... ﴿١٧٧﴾﴾ [البقرة].

واتە : چاکی تەنها بەوە نییە کە لە کاتی نوێژدا ڕوویکەنە خۆرهەڵات و خۆرئاوا بەڵکو چاکە ئەوەیە باوەڕ بە خوا و ڕۆژی دوایی وفریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەران بێنن ...

وە ئایەتی : ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ ﴿٢٨٥﴾﴾ [البقرة]

واتــە : پێغەمبــەر و بــاوەڕداران باوەڕیــان هێنــاوە بــە هــەموو ئەوانــەی لای پەروەردگاریــەوە بــۆی هــاتووە ، هــەموویان باوەڕیــان بــە خــوا و فریــشتەکان و کتێبــەکان و پێغەمبەران هەیە و هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا ناکەن ...

وە ئایــــــــەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ ﴾ [النساء]

واتــە : ئــەی کەســانێ کــە باوەڕتــان هێنــاوە ، بــاوەڕی ڕاستی بێنن بە خوا و بە پێغەمبەری خوا و بـەو کتێبـەی کـە دابەزیوە بۆ پێغەمبەرەکەی ـ واتە : قورئان ـ ، وە بە کتێبێ کە بەر لە قورئان ناردوویەتی ، هەر کەسێ بێ بـاوەڕ بـێ بـە خــوا و فریــشتەکانی و کتێبــەکانی و پێغەمبــەرانی و ڕۆژی دوایی ئەوە گومڕا بووە گومڕایەکی دوور لە هەق .

وە ئایەتی : ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾﴾ [الحج]

واتە : ئایا نازانی کە بە ڕاستی خوا ئەوەی لە ئاسمان و زەوی دایە دەیزانێ ؟ چونکە هەموو ئەوانە لە کتێبێك دا نووسراوە بە ڕاستی ئەوە لە سەر خوا ئاسانە 0

**بەڵام فەرموودە ( صحیح )ـەکان گەلێ زۆرن ، لەوانە :**

ئەو فەرموودە ( **صحیح** )ـە بەناوبانگەی ئیمامی موسلیم لە ( **صحیح** )ـەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە ئیمامی عومەرەوە - خوای لێ ڕازی بێ - کە دەفەرموێ :

**«إِنَّ جِبْرِيلَ عليه السلام سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الإِيـمَان ؟ فَقَالَ لَهُ : الإِيـمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّه وَمَلاَئِكَته وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ»** [الحديث وأخرجه الشيخان من حديث أبي هريرة رضي الله عنه ]

واتە : جبریل پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئیمان ؟ ئەویش فەرمووی : ئیمان بریتیە لەوەی باوەڕت ببێ

بـە خـوا و فریـشتەکانی و پێغەمبـەرانی و ڕۆژی دوایـی ، وە باوەڕت ببێ بە قەدەری چاك و خراپ .

هەموو ئەوشتانەی کە پێویستە موسڵمان باوەڕی پێیان هەبێ وەکو باوەڕبوون بە خوا و ڕۆژی دوایی ، و شـاراوەکان ، هەموو ئەمانە لەم شەش بنچینەیەوە سەرچاوەدەگرن :

## بنچینەی یەکەم : باوەڕ بوون بە خوا

باوەڕبوون بە خوای گەورە بەوە ئەبێ ، کە باوەڕت ببێ خوای گەورە پەرستراوی ڕاستەقینەیە و شایستەی پەرسـتنە ، جگە لەو هیچ کەس و شتێکی تر شایستەی پەرسـتن نیـیە ، چونکە خوا بەدیهێنەری خەڵکییە و چاکەیان بەرانبەر ئـەو او ڕۆزیان ئەدا و زانایـە بـە پـەنهان و ئاشـکرایان ، هـەر ئـەو تونـای هەیـە پاداشـتی چـاکە کارانیـان بداتـەوە و سـزای تاوانبارانیشیان بدات .

خوای گەورە ئادەمیزاد و جنۆکەی تەنها بۆ پەرستن بـەدی هێناوە، فەرمانیـشی بـەوە پـێ کـردوون وەکـو دەفـەرموێ

﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝ مَا أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ۝ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ ۝ ﴾ [الذاريات]

واتە : جنۆکە و ئادەمیزادم بۆ هیچ دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە عیبادەتم بکەن ، ڕۆزیم لەوان ناوێ و ناشمەوێ خۆراکم بدەنێ ، بەڕاستی هەر خوایە ڕۆزی دەر و خاوەن هێز و دەسەلات

وە دەفەرموێ : ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ۝ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَّكُمْ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝ ﴾ [البقرة]

واتە : ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن ، ئەو پەروەردگارەی کە ئێوە و پێشینانی خوڵقاند بۆ ئەوەی خواپەرستی بکەن ، ئەو پەروەردگارەی کە زەوی کردووەتە فەرش بۆ ئێوە و ئاسمانیشی کردووەتە بینا و لە ئاسمانیش ئاو و بارانی بۆ ئێوە ناردوە ، بە هۆی ئەو بارانەوە هەموو

جۆرە میوەیەکی بۆ ڕۆزی (رزق)ی ئێوە لە زەوی ڕوواندووە ، کەوابوو هاوبەش بۆ خوا دامەنێن لە کاتێکدا کە ئەوانە ئەزانن .

هەروەها بێگومان خوای گەورە پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە و کتێبەکانی دابەزاندووە بۆ ڕوون کردنەوە و بانگەواز کردن بۆ ئەم ڕاستی‌یە ، وە بۆ ترساندن لە کردنی ئەوانەی پێچەوانەی ئەم ڕاستی‌یە دەوەستن ، وەکو خوای گەورە دەفەرمویێت : ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴿٣٦﴾ ﴾ [النحل]

واتە : بە ڕاستی ئێمە لە ناو هەر ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە تا خوا بە تەنها بپەرستن و دوور کەونەوە لە پەرستنی جگە لە خوا ، وەکو شەیتان و بت و فالچی و ... هتد

وە دەفەرموێ : ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾ [الأنبياء]

واتـە : ئێمـە بـەر لـە تـۆ هـیچ پێغەمبـەرێکمان ڕەوانـە نەکردووە ئیلا وەحیمان بۆ ناردووە کە بێجگـە لـە مـن هـیچ پەرستراوێك نییە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە من جا کەوا بوو تەنها من بپەرستن 0

وە دەفـــــەرموێ : ﴿الٓر كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ١ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۚ إِنَّنِي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ ٢﴾ [هود] .

واتە : ئەم قورئانە کتێـبێکە ئایەتەکانی تێر و تەسـەل کراوە و شەرح دراوە لە لایەن خوایەکی زانـا و دانـاوە ، پێیان بڵێ هیچ کەس و شتێکی تر نەپەرستن جگە لـە خـوا ، وە بڵێ من تەنها موژدەر و ترسێنەرم .

حەقیقەتی ئەم پەرستنەش بریتییە لـە تـاك کردنـەوەی خوا لە هەموو ئەو پەرستنانەی بەندە ئەنجامیان ئەدات ، لـە پاڕانەوە و ترس و ئومێدپێبوون و نوێژ و ڕۆژو و سـەربڕین و نـەزر و چـەندین شـتی تـر لـە جۆرەکـانی پەرسـتن ، بـە مـل کەچی و ترسەوە لە گەڵ تەواوی خۆشەویستیدا بۆ خوا 0

زۆربەی ئایەتەکانی قورئان لە باسکردنی ئەم بنچینە گەورەیەدا دابەزیوون وەکو ئایەتی : ﴿فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ۝٢ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ ۝٣﴾ [الزمر]

واتە : خوا بپەرستە و گەردن کەچێتی بۆ ساغ بکەرەوە ، وە بزانە پەرستن و گەردن کەچێتی تەنها بۆ ئەوە 0

وە ئایەتی : ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ۝٢٣﴾ [الإسراء]

واتە : وە پەروەردگارت فەرمانی داوە کە بێجگە لەو نەپەرستن تەنها ئەو نەبێ .

وە ئایەتی : ﴿فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١٤﴾ [غافر]

واتە : جا هاوار لە خوا بکەن و پەرستنی خۆتان بە دڵسۆزی و بە پاکی بۆ ئەو ئەنجام بدەن ، هەرچەند کافران پێیان ناخۆش بێت .

وە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە لە (**معاذ**)ەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت : ((حَقُّ اللّٰه عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً)) .

واتە : مافی خوا بە سەر بەندەکانەوە ئەوەیە کە بە تەنها بیپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدەن .

❑ **لە باوەڕ بوون بە خوا** : باوەڕ بوونە بە هەموو ئەوانەی خوا لە سەر بەندەکانی پێویستی کردووە ، وەکو پێنج پایەکانی ئیسلام کە بریتین لە شایەتوومان و نوێژکردن و زەکاتدان و ڕۆژووگرتن و حەج کردن بۆ کەسێ کە بتوانێ ، وە جگە لەمانە لەو ( **واجب** )انەی کە لە شرع دا هاتوون .

گرنگ و گەورەترین پایە لە پایەکانی ئیسلام بریتی‌یە لە شایەتوومان ، کە شایەتی دانە بەوەی کە هیچ خوایەك نی‌یە شیاوی پەرستن بێت تەنها خوای گەورە نەبێ ، وە شایەتی دانە بەوەی کە محمد ﷺ پێغەمبەری خوایە 0

کەوابوو شایەتی دان بە ( **لا إله إلاّ الله** ) ئەوە پێویست دەکات کە پەرستن بە پاکی تەنها بۆ خوا ئەنجام بدرێ و بۆ هیچ کەسی تر ئەنجام نەدرێ ، ئەمە واتای ( **لا إله إلاّ الله** )یە ، واتاکەی ئەوەیە کە هیچ پەرستراوێك نی‌یە شایەنی پەرستن بێ تەنها خوا نەبێ ، هەموو ئەوانەی جگە لە خوا

دەپەرستریێن لە مرۆڤ و فریشتە و جنۆکە و شتانی تر بە بەتاڵ و ناڕەوا دەپەرستریێن ، ئەوەی بە ڕاستی شیاوی پەرستنە تەنها خوایە و بەس ، وەکو دەفەرمویێ : ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ ﴿٦٢﴾ ﴾ [الـحج]

واتە : ئەو خوایە و ئایینەکەشی و پەرستنی بە تەنها ڕاست و ڕەوایە ، وە ئەوانەی کە جگە لە خوا دەپەرستریێن شیاوی پەرستن نین .

پێشتر ئەوە ڕوون کرایەوە کە خوا ئادەمیزاد و جنۆکەی بۆ پەرستن بەدیهێناوە و فەرمانیشی بەوە پێ کردوون ، پێغەمبەرانی بۆ ئەو مەبەستە ڕەوانە کردووە ، کتێبەکانی دابەزاندووە بۆ هەمان مەبەست ، کەوابوو بە باشی بیر لەوە بکەرەوە و تێ بفکرێ بۆ ئەوەی بۆت دەرکەوێ کە زۆربەی موسڵمانان تووشی چ نەفامیەکی گەورە بوون بەرانبەر ئەم بینچینە گرنگ و بە نرخە ،

ئەنانەت لە گەڵ خوادا شتی تریان پەرستووە و مافی پەرستنی تایبەتی خوایان دا بە کەسانی تر .

❑ **لە باوەڕ بوون بە خوا :** باوەڕ بوونە بەوەی کە خوا بەدیهێنەری هەموو جیهانە و هەڵسوڕێنەری کاروباریانە و فەرمانڕەوایە بە سەریانەوە بە زانست و توانای خۆی ، بە هەر شێوەیەك خۆی بیەوێ ، خوای گەورە خاوەن و پادشای دونیا و ڕۆژی دوایییە و پەروەردگاری هەموو جیهانیانە و هیچ بەدیهێنەرێکی تر جگە لەو نییە

❑ **لە باوەڕبوون بەخوا :** باوەڕ بوونە بەوەی کە خوا پێغەمبەرانی ناردووە و کتێبەکانی دابەزاندووە بۆ چاك کردنی بەندەکان و بانگەوازکردن بۆ شتانێ کە ڕزگاربوونی ئەوانی تێدایە لە ئێستا و ئایندەدا ، وە باوەڕبوون بەوەی کە خوا لە هەموو ئەمانە هیچ هاوبەش و هاوەڵێکی نییە وەك دەفەرموێ : ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ٦٢﴾ [الزمر]

واتە : خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە , و هەر ئەویش پارێزەری هەموو شتێکە

وە دەفەرموێ : ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ (٥٤)﴾ [الأعراف]

واتە : بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە ئەو خوایەیە ، کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا خەلق کرد لە پاشان لەسەر عەرشدا بەرز بووەوە ، و بە تاریکی شەو ڕۆژ دائەپۆشێ و شەو بەدوای ڕۆژدا بەبێ دواکەوتن ئەروات ، خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی بەدیهێنا لەحاڵەتێکدا ژێربارى فەرمانی خوان ، دروستکردن و فەرمان تەنها بۆ ئەوە ، پڕ بەرەکەتە خوایەك کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە

❑ **لە باوەڕ بوون بە خوا** : باوەڕ بوونە بەو ناو و سیفەتە بەرز و جوانانەی کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوون ، بەبێ دەست کاری و پەکخستن و چۆنیەتی بۆ دیاری کردن و

وێکچواندن ، بەڵکو پێویستە چۆن هاتووە ئاواش بڕوات ، لە گەڵ باوەڕ بوون بەو واتا گرنگ و گەورانەی دەیگەیەنن ، کە سیفاتی خوان ، پێویستە بەوانە وەسف بکرێ بەشێوازێکی شیاو بەبێ وێکچواندن بە دروستکراوەکانییەوە لە هیچ سیفەتێك لە سیفەتەکانی دا ، وەکو دەفەرموێ : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ [الشورى]

واتە : هیچ شتێك بەوێنەی خوا نەیە ، وە ئەوە بیسەر و بینەری ڕەها

وە دەفەرموێ : ﴿فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾﴾ [النحل]

واتە : جالەبەر ئەوە بۆ خوا هاوشێوە دامەنێن ، بەڕاستی خوا دەزانێ و ئێوە نازانن .

ئەمە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە بوو ، لە هاوەڵان و شوێن کەوتوانیان : وەکو پێشەوا ( **أبو الحسن الأشعري** ) خوای لێ ڕازی بێت لە کتێبی ( **المقالات عن**

**أصحاب الحديث وأهل السنة** ) مێناویەتی ، وە چەندین کەسی تر لە زانایان و ئیمانداران هێناویانە

پێشەوا ( **الأوزاعي** ) - خوای لێ ڕازی بێت - فەرموویەتی ((پرسیار کراوە لە زوهری و مەکحول دەربارەی ئایەتەکانی سیفات فەرمویانە : وەکو چۆن هاتوون با ئاواش برۆن)).

وەلیدی کوڕی موسلیم - خوای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی : ((پرسیار کراوە لە مالك و ئەوزاعی و ( **لیث** )ی کوڕی سەعد و سوفیانی ( **ثوري** ) - ڕەحمەتی خوایان لێ بێت - دەربارەی ئایەتەکانی سیفات ؟ هەموویان فەرموویانە چۆن هاتوون با ئاواش برۆن بەبێ چۆنیەتی بۆ دانان)) .

ئەوزاعی - خوای لێ ڕازی بێت - فەرموویەتی : ((ئێمە کاتێ شوێنکەوتووان زۆریان لەژیاندا مابوون ئەمانگووت خوا لەسەر عەرشدایە ، وە باوەڕمان هەیە بە هەموو ئەو سیفەتانەی لە سوننەتدا هاتوون))

هەروەها کاتێ پرسیار کراوە لە ( **ربيعة** )ی کوڕی ( **أبو عبد الرحمن** ) مامۆستای ئیمامی مالك - خوای لێ ڕازی بێت - دەربارەی

( **الإستواء** ) فەرموویەتی: (( **الإستواء** ڕاستە و زانراوە و چۆنێتی باس ناکرێ ، سەرچاوەی پەیام هی خوایە و پێغەمبەر تەنها ڕاگەیاندنی لەسەرە و ئێمەش باوەڕ پێ کردنی)) .

کاتێ پرسیار کراوە لە پێشەوا مالك - خوای لێ ڕازی بێت - دەربارەی ( **الإستواء** ) فەرموویەتی : (( ( **الإستواء** ) زانراوە ، چۆنێتی نەزانراوە ، باوەڕ بوون پێی پێویستە ، پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە ، پاشان بەخاوەن پرسیارەکەی ووت : من تۆ بەکابرایەکی خراپ دەزانم ! فەرمانی دا بەدەرکردنی و دەریان کرد )) . بەهەمان واتا ڕیوایەت کراوە لە دایکی ئیماندارانەوە ( **أم سلمة** ) - خوای لێ ڕازی بێت - .

پێشەوا ( **أبو عبدالرحمن بن المبارك** ) - خوای لێ ڕازی بێت - فەرموویەتی : ((بەو شێوەیە خواکەمان دەناسین کە لەسەرووی ئاسمانەکان دایە و لە سەر عەرشە و جیاوازە لە دروستکراوەکانی)) .

وتەی زانایان و پێشەوایان لەم بابەتەدا زۆرە ناتوانرێت هەمووی لەم نامیلکەیەدا باس بکرێ ، هەرکەس ئەیەوێ بەو

ووتانە ئاشنا ببێ بابگەڕێتەوە بۆ نووسراوی زانایانی ئەهلی سوننە لەم ڕووەوە ، وەکو کتێبی ( **السنة** ) لە نوسینی ( **عبدالله کوڕی ئیمامی ئەحمەد** ) و کتێبی ( **التوحید** ) لە نوسینی ( **محمەدی کوڕی خوزەیمە** ) و کتێبی ( **السنة** ) لە نوسینی ( **أبوبکر بن أبي عاصم** ) و وەڵامەکەی شێخی ئیسلام ( **ابن تیمیة** ) - خوای لێ رازی بێ - بۆ خەڵکی ( **حماه** ) ، کە وەڵامێکی زۆر گرنگ و بە سوودە ، بەڕاستی بیرو باوەڕی ئەهلی سوننەی تێدا ڕونکردووەتەوە ، زۆر لەوتەی زانیان و بەڵگەی شەرعی و عەقڵی تێدا هێناوە لە سەر ڕاستێتی ئەوەی ئەهلی سوننە فەرموویانە ، وە بۆ پوچەڵ کردنەوەی قسەی نەیارەکانیان .

هەروەها لەنامیلکەی ( **التدمرية** )شدا درێژەی بەم باسە داوە و بیروباوەڕی ئەهلی سوننەی تێدا ڕوونکردووەتەوە بە بەڵگەی شەرعی و عەقڵی ، وە بەر پەرچی نەیارەکانی داوەتەوە ، بەشێوەیەکی وا کە حەق سەرخا و ناحەق لە بن

دەربێنیێ بۆ هەر زانایەك بە نیازی پاك و بە مەبەستی ناسینی حەقەوە تەماشای بكات .

هەر كەس پێچەوانەی ئەهلی سوننە بێ لە باوەڕ بوون بەناو و سیفەتەكانی خوا ، ئەوا بێ گومان دەكەوێتە ناو پێچەوانە كردنی بەڵگە نەقڵی و عەقڵیەكانەوە ، لەگەڵ نەسازیەكی ڕوون و ئاشكرادا لە هەموو ئەوانەی نەفیان دەكات و دەیانسەلمێنێ .

ئەهلی سوننە و جەماعە هەرچی خوا و پێغەمبەر ﷺ سەلماندویانە لە قورئان وسوننەتی (**صحيح**) دا ، ئەوانیش بۆ خوای دەسەلمێنن بەبێ وێكچواندن (**تشبيه**) ، وە پاك رایدەگرن لە (**لەیەك چوون**) لە گەڵ دروستكراوەكانی دا پاك ڕاگرتنێك كە پەكخستنی سیفەتەكانی تێدا نەبێت ، ئەهلی سوننە ڕزگاریان بووە لە تووش بوون و نەسازی (**التناقض**) و كاریان بە هەموو بەڵگەكان كردووە ئەمەش سوننەتی خوایە لە كەسانێكدا دەستیان بگرن بە حەقەوە ، چی لە توانایاندا هەیە بە دڵسۆزی بۆ خوای ئەنجام بدەن ،

کە یارمەتیان بدات و ڕێگەی ڕاستیان بۆ ئاسان بکات و بەڵگەیان سەربخات ، وەکو خوا دەفەرموێ : ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ [الأنبياء]

واتە : بەڵکو ئێمە حەق ئەکەین بەسەر باتڵ دا تا ناحەق لەناو دەبا جا لەناکاو ناحەق لەناو دەچێ .

وە فەرموی : ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾ ﴾ [الفرقان]

واتە : موشریکەکان هیچ پرسیار و پێشنیارێك بۆ تۆ ناهێنن ئیلا ئێمەش لەبەرانبەریاندا وەڵامی حەق و چەسپاو و باشترین تەفسیرت بۆ ئەنێرین .

زانای پایەبەرز ( **الحافظ ابن كثير** ) ـ خوای لێ ڕازی بێت ـ لەتەفسیرە بەناوبانگەکەیدا لە تەفسیری ئایەتی : ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ﴿٥٤﴾ ﴾ [الأعراف]

واتــە : بەڕاســتی پــەروەردگارتان ئــەو خوایەیــە کــە ئاسمانەکان و زەوی لەشەش ڕۆژدا بەدیهێنا پاشان لەسەر عەرش بەرز و بڵند بووەتەوە.

لـە تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا قسەیەکی بەنرخی باس کردووە کە دەفەرموێ : (خەڵکی لـەم مەسـەلەدا ڕا و قسەی جیاوازیان هەیە ، ناتوانرێ لێرەدا هەمووی باس بکرێ ، بەڵام ئەوە هەیە ئێمە پەیڕەوی مەزهەبی پێشین دەکەین وەکو ئیمامی مالک و ئەوزاعی و ثوری و ( **لیث** )ی کوڕی سەعد و شافعی و ئەحمەد و ئیسحاقی کوڕی ( **راهویە** ) ، وە چەندین کەسی تر لە پێشەوایانی موسڵمانان لە کۆن و تازەدا ، مەزهەبی ئەوانیش بریتییە لەوەی ناو و سیفەتەکانی خوا چۆن هاتوون با ئاواش بڕۆن بەبێ ( **تکییف** ) چۆنیەتی و ( **تشبیە** ) وێکچواندن و ( **تعطیل** ) پەکخستن ، ئەوەی دێت بە مێشکی ئەوانەی ( **تشبیە** ) دەکەن دوورە لە خواوە ، چونکە هیچ شتێك هاو وێنەی خوا نیەیە ، خوا گەورە و بیسەر و بینایە ، بەڵکو پێشەوایان

لەوانە (**نعيم بن حماد الخزاعي**) مامۆستای ئیمامی بوخاری فەرموویەتی : هەرکەسێ خوا بەدروستکراوەکانی بشوبهێنێ ئەوا کافر دەبێ ، وە لەو وەسفانەی خوا بۆ خۆی کردوە و پێغەمبەر ﷺ بۆی کردوە هیچ (**تشبيه**) یێك نیيە ، ئەوەی ئەو ناو و سیفەتانەی کە لە قورئان و سوننەتی (**صحيح**)دا هاتوون بسەلمێنێ بۆ خوا (بەو جۆرەی کە شیاوە بە بەرزی خواوە) ، وە نەفی کەم و کوڕی بکات ئەوە بەڕاستی ڕێگەی هیدایەتی گرتووەتە بەر .

## بنچینەی دووەم : باوەڕبوون بە فریشتەکان

باوەڕبوون بە فریستەان بە دوو شێوە دەبێ: بە **کورتی**)، و بە (**ورد و درێژی**)، بە کورتی موسڵمان باوەری بەوە هەیە

كە خوا فریشتەی هەیە، بەدیهێناون بۆ گوێ ڕایەڵی كردنی، وەسفی كردون بەوەی كە بەندەی بەڕێزن ، ووتەی خۆیان پێش ووتەی خوا ناخەن ، كردار بەفەرمانی ئەو دەكەن :

﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ [الأنبياء]

واتە : خوا كردەوەی ئەمڕۆ و داهاتووی ئەوانە دەزانێ هەروەها ڕابوردویان دەزانێ ، ئەوانە تكا و شەفاعەت ناكەن مەگەر بۆ ئەو كەسەی كە خوا لێی ڕازییە تكای بۆ بكەن مەلائیكەكان لە ترسی گەورەیی خوا لەترس دان .

فریشتەكان چەندەها پۆلی جیاوازن ، هەندێكیان هەڵگرتنی ( **عەرش** ) یان پێ سپێردراوە ، هەندێكیان دەرگاوانی بەهەشت و دۆزەخن ، هەندێكیان كردەوەی بەندەكان دەنووسنەوە ، ئەمە بە كورتی

بەڵام بە درێژی باوەڕمان بە ئەوانە هەیە كە خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ ناوی بردون وەكو : **جبریل** ، **میكائیل** ، **مالك** ـ كە دەرگاوانی دۆزەخە ـ ، **ئیسرافیل** ـ كە فوو كردن

بە (صور) ی پـێ سـپێردراوە ، کـە لـە چـەندین فـەرموودەی صەحیح دا باس کراوە

سەلمێنراوە لە (عائیشة) وە - خوای لێ ڕازی بێت - کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ((خُلقَتِ الْمَلاَئكَةُ مِنْ نُورٍ ، وَخُلقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ ، وَخُلقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ)) [أخرجه مسلم في صحيحه]

واتە فریشتەکان لە نور دروست کراون ، جنۆکەیش لە بڵێسەی ئاگر ، ئادەمیش لەوەی کە بۆتان باسکراوە واتە لە گڵ - خۆڵ - .

## بنچینەی سێ یەم : باوەڕ بوون بە کتێبەکان

**بە کورتی :** پێویستە کە باوەڕمان هەبێ کە خوای گەورە چەندین کتێبی ناردووە بۆ سەر پێغەمبەرانی ، بۆ ڕوونکردنەوەی مافی خوا و بانگەواز بۆ لای ئەو ، وەکو دەفەرموێ : ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ﴿٢٥﴾﴾ [الحديد]

واتە : بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمان بە موعجیزەوە ناردووە ، و لە گەڵیشیاندا کتێبی ئاسمانی و دادوەریمان ناردووە تا خەڵك دادوەری بخەنە بەرچاو ، واتە : فرمانمان بە دادوەری کردون .

وە دەفەرموێ : ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ ۚ وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا الَّذِينَ أُوتُوهُ مِن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ۖ فَهَدَى اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ ۗ وَاللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾﴾ [البقرة]

واتە : خەڵك لە سەرەتاوە لە سەر یەك ئاین بوون ، پاشان جیاوازیان تێ کەوت ، و خوای پەروەردگاریش پێغەمبەرانی بە موژدەری و ترسێنەریەوە بۆ ناردن ، وە لە گەڵ ئەواندا کتێبی بۆ ناردوون ، بۆ ئەوەی لە جیاوازیەکانی نێو خەخەڵکدا دادوەری بکەن .

**وە بەورد و درێژی** : باوەڕمان هەیە بەوانەی خوا ناوی بردوون وەکو : ( **تەورات ، و ئنجیل ، و زەبوور ، و قورئان** ) .

قورئانی پیرۆز کۆتا ترین و باشترین کتێبی خوایە و بەسەر ڕاگەیشتو و بە ڕاستخەرەوەی باقی کتێبەکانی ترە

لە سەر هەموو موسڵمانان پێویستە شوێنی بکەون و حوکمی پێ بکەن هەروەها بەو فەرموودانەی کە سەلمێنراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ

چونکە خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ ی ناردووە بۆ گشت جنۆکە و ئادەمیزاد ، وە ئەم قورئانەی بۆ ناردوون بۆ ئەوەی حوکمی پێ بکەن لە نێوانیاندا ، وە خوا کردویە بە شیفای دڵان ، قورئانی گێڕاوە بە ڕونکەرەوە بۆ هەموو شتێ ، وە بە

هیدایەت و ڕەحمەت بۆ باوەڕداران ، وەکو خوا دەفەرموێ :

﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾﴾ [الأنعام]

واتە : ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە دامانبەزاندوە پەیڕەوی پێ بکەن ، و تەقواتان هەبێ بەڵکو بەر ڕەحمەتی خوا بکەون .

وە دەفەرموێ : ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾﴾ [النحل] .

واتە : ئەم قورئانەمان بۆ ناردی کە ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە و هۆی ڕێنموونی و ڕەحمەت و مژدەیە بۆ موسڵمانان.

وە دەفەرموێ : ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾﴾ [الأعراف].

واتە : بڵێ ئەی خەڵکینە بەڕاستی من نێردراوی خوام بۆ لای هەمووتان ، ئەو خوایەی کە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی تایبەتی ئەوە ، پەرەستراوێکی‌تر نی‌یە شایستەی پەرەستن بێت جگە لەو نەبێت ، هەر ئەوە زیند و دەکاتەوە و دەمرێنێ ، جا باوەڕ بە خوا و پێغەمبەری خوا بێنن ، ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەی کە باوەڕی بە خوا و گوفتارەکانی خوا هەیە ، شوێنی بکەون تا ڕێنمونی بکرێن .

وە چەندین ئایەتی تر کە لەم ڕووەوە هاتوون .

## بنچینەی چواردەم : باوەڕبوون بە پێغەمبەران

پێویستە باوەڕمان بە پێغەمبەران هەبێ ، **بە کورتی :** باوەڕمان هەیە کە خوای گەورە پێغەمبەری بۆ بەندەکانی ناردووە بۆ ئەوەی مژدەی بەهەشت بە چاکە کاران بدەن ، و خراپە کارانیان بە دۆزەخ بترسێنن ، وە بانگەواز کاربن بۆ هەق . هەر کەس وەڵامیان بداتەوە دەگاتە خۆشبەختی رۆژی دوایی ، وە ئەوەش کە دژیان بوەستێ تووشی پەشیمانی و ناومێدی دەبێ ، کۆتا و باشترینی پێغەمبەران پێغەمبەری خۆمانە ﷺ

خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴿٣٦﴾ ﴾ [النحل]

واتە بەڕاستی ئێمە لە ناو هەر ئومەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار بە تەنها بپەرستن و دوورکەونەوە لە پەرستنی جگە لە خوا ، وەکو شەیتان و بت و جادووگەر و هتد

وە دەفـــــەرمووێ : ﴿ رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ﴿١٦٥﴾ ﴾ [النساء]

واتە : پێغەمبەرانێ کە مژدە دەر و ترسێنەر بوون بۆ ئەوەی خەڵك دوای ناردنی ئەم پێغەمبەرانە هیچ بەڵگە و بیانویەکیان نەمێنێ .

وە دەفەرمووێ : ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴿٤٠﴾ ﴾ [الأحزاب]

واتە : موحەممەد باوکی هیچ یەك لە پیاوانی ئێوە نیە . واتە : باوکی ڕاستەقینەی زەید کوڕی حاریسە نیە - خوای لێ ڕازی بێت - بەڵام ئەو پێغەمبەری خوایە و دوایین پێغەمبەریشە .

خوای گەورە لە قورئاندا هەرکامیانی ناو بردبێ و پێغەمبەریش ﷺ لە سوننەتدا ، ئێمە باوەڕی پێدەکەین وەکو نووح و هود و صاڵح و ئیبراهیم و ئەوانی تر - دروود و سڵاوی خوایان لە سەر بێت - .

# بنچینەی پێنجەم : باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی

بەنیسبەت باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی یەوە باوەڕبوون بە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە خوا و پێغەمبەر ﷺ هەواڵیان پێداوین ئەوانەی لە دوای مردن ڕوو ئەدەن وەکوو لە پرسینەوە و خۆشی و سزای گۆڕو ئەوانەی لە هەستانی قیامەتدا ڕوو ئەدەن وەکوو سەختی و ناڕەحەتی ئەو ڕۆژە و پردی ( **صراط** ) و دانانی تەرازو و لێ پرسینەوە و پاداشت و تۆڵە و پەخشی نامەی کردەوەکان لە نێوان خەڵکدا ، یەکێک بەدەستی ڕاستیەوە و یەکێک بەچەپی یان لەپشتی یەوە ، هەروەها باوەڕ بوون بە حەوزی کەوسەر کە ئامادەکراوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و باوەڕبوون بە بەهەشت و ئاگر و بینینی خوای پەورەدگار و قسەکردنی باوەڕداران لەگەڵ خوا ، و چەندین شتی تر کە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی ( **صحیح** ) ی پێغەمبەردا ﷺ هاتوون کە پێویستە باوەڕمان پێیان هەبێت ، بەو شێوەیەی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بەیان و ئاشکرایان کردووە

## بنچینەی شەشەم : باوەڕبوون بە قەدەر

باووەڕبوون بەقەدەر باوەڕبوون بە چوارشت لە خۆ دەگرێ :

**یەکەم :** خوای گەورە عیلمی ئەوەی ڕویداوە ، و ئەوەش ڕوونەدات زانیویە و دەیزانێ ، باری بەندەکان و ڕۆزی و ئاکامی کردەوەیان دەزانێ وە کاروباریان لە خوا ون نابێ .

وەك دەفەرمووێ : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٧٥﴾﴾ [الأنفال]

واتە : بەڕاستی خوای پەروەردگار زانا و بە ئاگایە بە هەموو شتێ .

وە دەفەرمووێ : ﴿لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىۡءٍ عِلۡمَۢا ﴿١٢﴾﴾ [الطلاق] .

واتە : تا بزانن کە خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە و بەڕاستی خوا زانستی بە هەموو شتێك هەیە .

**دووەم :** خوا ئەوەی تەقدیری کردبێ و بڕیاری دابێ و نوسیویەتی، وەکو دەفەرمووێ :

﴿قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ ﴿٤﴾﴾ [ ق ] .

واتە: بەڕاستی ئێمە دەزانین کە خۆڵ چ ڕادەیەك لە لەشیان کەم دەکاتەوە و دەیکاتە خۆڵ ، و کتێبێ کە پارێزەری هەموو شتێکی تێدایە کە (اللوح المحفوظ) لە لای ئێمەیە

وە دەفەرمووێ : ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ (١٢)﴾ [یس].

واتە : وە هەموو شتێکمان لە لەوحی مەحفوزدا ژماردوە و بەژمارە نوسیومانە

وە دەفەرموێ : ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّ ذَلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ (٧٠)﴾ [الحج]

واتە : ئایا نازانی کە بە ڕاستی خوا ئەوەی وا لە ئاسمان و زەوی دایە ئەیزانێ ؟ چونکە هەموو ئەوانە لە کتێبدایە نوسراوە ، بەڕاستی ئەوە بۆ خوا زۆر ئاسانە

**سێ یەم :** باوەڕبوون بەویستی (تەواو و ڕێگە نەگیراوی) خوا ، واتە : هەرچی بیەوێ ببێ ئەبێ و ئەوەیشی نەیەوێ ببێ بێگومان نابێ وەکو دەفەرموێ : ﴿إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ (١٨)﴾ [الحج]

واتە : بەڕاستی خوا چی بوی دەیکا

وە دەفـــــــەرمووێ : ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾﴾ [يس]

واتە : بەڕاستی فەرمانی ئەو ئەوەیە کە هەر کاتێ بیەوێ شتێ بەدی بهێنێ پێ ی دەڵێ : ببە جا بێ دواکەوتن دێتە دی .

وە دەفــەرمووێ : ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ [التكوير]

واتە : ئێوە ئیرادە ناکەن تا پەروەردگاری جیهان ئیرادە نەکات .

**چوارەم :** هەموو بونەوەران خوا بەدی هێناون ، جگە لەو هیچ بەدیهێنەرو پەروەردگارێکی‌تر نی‌یە

وەکو دەفەرمووێ : ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾﴾ [الزمر]

واتــە : خــوا بەدیهێنــەری هــەموو شــتێکە و هــەر ئــەویش پارێزەری هەموو شتێکە وە تەکبیریان بەدەستی ئەوە بەبێ هاوبەش .

وە دەفەرمـــوێ : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٣﴾ ﴾ [فاطر]

واتە : ئەی خەڵکینە نیعمەتێ کە خوا بە ئێوەی داوە بیهێننەوە بیر ، ئایە جگە لەخوا بەدیهێنەری تر هەیە کە لە ئاسمانەکان و زەوی ڕۆزیتان بدات ؟ بێجگە لەو پەرستراوێکی تر نیيە ، جا چۆن درۆ دەکەن و لە هەق لائەدەن

کـەوا بـوو بـاوەڕبوون بـە قـەدەر لای ئـەهلی سـوننەت باوەڕبوون بەم چوار شتە دەگرێتەوە ، بە پێچەوانەی ئـەهلی بیدەعەوە کە هەندێ لەم چوارەیان ئینکار کردوە

**لەباوەڕ بوون بەخوا** : باوەڕبونە بەوەی بـاوەڕ بریتیـە لـە ووتەو کردەوە ، بەچاکە کردن زیاد دەکـات و بـەتاوان کـردن کەم دەکات ، و دروست نیە هیچ کەس لە موسڵمانان بـەکافر دابنرێ بەهۆی کردنی تاوانێکەوە کـە لەشـیرك و کـوفر بـچوك تر بێ وەکو داوێن پیسی ( **زینا** ) و دزی کردن و سوو خواردن و خواردنەوەی مەی و ئەزیەت دانی دایك و بـاوك وە چـەندین

شتی گەورەتر لە تاوانە گەورەکان ، مەگەر حەڵاڵیان بکات لەبەر ئەم ئایەتە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴿٤٨﴾ ﴾ [النساء].

واتە : بەڕاستی هەرکەس هاوبەش بۆ خوا دابنێ نایبەخشێ بەڵام کەمتر لەوە یان جگە لەوە بۆ هەرکەس بیەوێ ئەی بەخشێ .

وە لە بەر ئەوەی سەلمێنراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە فەرموودەی ( **متواتر** )دا فەرموویەتی «إِنَّ اللَّهَ يُخْرِجُ مِنَ النَّارِ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ» .

واتە : بەڕاستی خوا هەرکەسێ بە ئەندازەی تۆسقالە خەردەلێك ئیمانی لە دڵدا بێ لە ئاگری دۆزەخ نایهێڵێ

**لە باوەڕبوون بەخوا** : ئەوەیە خۆشەویستی و ڕق لێ بوونت هەر لە بەر ئەوە بێ و دۆستایەتی و دژایەتی کردنت لەبەر ئەو بێت ، کەوا بوو باوەڕدارانی خۆش ئەوێ و دۆستایەتیان لەگەڵ ئەکات بەتایبەت هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و ڕقی لە بێ باوەڕانە و دژایەتیان لەگەڵ ئەکات .

**ئەهلی سوننە و جەماعە** هاوەڵانیان خۆش ئەوێ وە دۆستایەتیان لە گەڵدل دەکەن و باوەڕیان وایە ئەوان باشترینی خەڵکن لە دوای پێغەمبەران ، لە بەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ : ((خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)) [متفق عليه]

واتە : چاکترین خەڵکی ئەوانەن کە لەسەردەمی مندا ژیاون ، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان ، ئینجا دوای ئەوان .

**ئەهلی سوونە** باوەڕیان وایە باشترین هاوەڵان (**أبو بكر**)ە پاشان (**عمر**) پاشان (**عثمان**) پاشان (**علي**) ـ خوا لە هەموویان ڕازی بێ ـ دوای ئەوان ئەوانی تر لەو دە کەسەی کە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە ، پاشان هەموو هاوەڵان ـ خوا لە هەموویان ڕازی بێ ـ .

**ئەهلی سوننە** زمانیان ئەگرن لەوەی کە لە نێوانیاندا ڕوویداوە ، باوەڕیان وایە هاوەڵان هەموو لەو کارەدا ( **مجتهد** ) بونە ، ئەوەی پێکابێتی ئەوە دوو جار پاداشتی ئەدرێتەوە ، ئەوەیشی نەی پێکابێ ئەوەش هەر یەک پاداشتی ئەدرێتەوە.

**ئەهلی سوننە** کەسو کاری موسڵمانی پێغەمبەریان خۆش دەوێ و دۆستایەتیان لەگەڵ دەکەن بە هەمان شێوە بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر دایکانی ئیمانداران لە هەموویان رازین و قسەیان پێ ناڵێین .

**ئەهلی سوننە** خۆیان بەری دەکەن لە رێبازی شیعە کە رقیان لە هاوەڵانی پێغەمبەرە و جنێویان پێ ئەدەن ، وە زیادە رەوی دەکەن لە سەناکۆی خزم و کەس و کاری پێغەمبەردا ﷺ لەو پلەو پایەی خوا بۆی داناوون و زیاتریان بۆ دادەنێن ، لە هەمان کاتدا ئەهلی سوننەت خۆیان بەری دەکەن لە رێبازی خەوارج ، ئەوانەی کە لە رێزی خزم و کەس و کاری پێغەمبەر ﷺ کەم دەکەنەوە بەقسەو کرداری خراپ ئەزیەتیان ئەدەن

هەموو ئەمانەی لەم وتارە کورتەدا خستمانە روو ( لە باسی ئەو بیرو باوەرە راستەقینەی کە خوا و پێغەمبەری ﷺ پێ ناردوە) کە بریتی یە لە بیروباوەری کۆمەڵی رزگاربووی ئەهلی سوننە و جەماعە کە پێغەمبەر ﷺ

دەربارەیان فەرموویەتی : ((لا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الْحَقِّ مَنْصُورَةٌ لا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ))

واتە : بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتی من لەسەر ڕاستی دەمێننەوە تاوەکو فەرمانی خوا دێتە جێ

وە دەفەرموێ : ((افْتَرَقَتِ الْيَهُودُ عَلَى إِحْدَى وَسَبْعِينَ فِرْقَةً ، وَافْتَرَقَتِ النَّصَارَى عَلَى اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً ، وَسَتَفْتَرِقُ هَذِهِ الأُمَّةُ عَلَى ثَلاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً كُلُّهُمْ فِي النَّارِ إِلا وَاحِدَةً ، فَقَالَ الصَّحَابَةُ : مَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ مَنْ كَانَ عَلَى مِثْلِ مَا أَنَا عَلَيْهِ، وَأَصْحَابِي))

واتە : یەهودی‌یەکان بوون بەحەفتا و یەك تاقمەوە ، گاورەکان بوون بەحەفتا و دوو تاقمەوە ، موسڵمانانیش لە ئایندەدا دەبن بەحەفتا و سێ تاقمەوە ، هەموویان دەچنە دۆزەخەوە تەنها یەکێکیان نەبێ ، هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کۆمەڵە کێن ؟ ئەویش فەرمووی : ئەوانەن کە لە سەر سوننەتی من و هاوەڵان دەڕۆن .

ئەمەش ئەو بیروباوەڕەیە کە پێویستە بەتووندی دەستی

پێوە بگیرێ و بەردەوام بین لەسەری و وریا بین لەو شتانەی پێچەوانەی دەوەستن ئەوانەی لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننە لایان داوە و چەندین ڕێچکەی تریان گرتووەبەر زۆرن ، لەوانەیە ئەوانەی بت و خەڵك و فریشتە و پیاوچاکان و جنۆکە و دار و بەرد و شتانی تر دەپەرەستن ئەمانە وەڵامی بانگەوازەکەی پێغەمبەریان نەداوەتەوە بەڵکو دژایەتی و سەرپێچیان کردووە وەکو قورەیش و تیرەکانی عەرەب بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ کردیان ، ئەمانە داوایان لە بتە کانیان دەکرد کە پێویستییەکانیان جێبەجێ بکەن و شیفای نەخۆشیندارەکانیان بدەن و سەرکەوتوویان بکەن بە سەر دوژمنەکانیاندا، ئەمانیش لە بەرامبەر ئەوانەدا شتیان بۆ سەر دەبرین و نەزریان بۆ دەکردن، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ ئەمەی لێقبوڵ نەکردن و فرمانی پێکردن بە یەکخواپەرستی سەریان سوڕما و نینکاریان کردوو وتیان : ﴿ أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَاحِدًا ۝٥ ﴾ [ص] .

واتە : ئایا هەموو خواکانی کردووەتە یەکخوا ! بەڕاستی

ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە !!!

بەردەوام و بێوچان پێغەمبەر ﷺ بانگی دەکردن بۆ یەکخواپەرستی و دەیترساندن لە شرك ، وە ڕاستی بانگەوازەکەی بۆ والآ دەکەردن ، هەتاوەکو خوای گەورە هەندێکی هیدایەت داو پاشان بە کۆمەڵ هاتنە ناو ئاینی ئیسلامەوە ، ئینجا لە دوای بانگەوازێکی بەردەوام و جیهادێکی دور و درێژ لە لایەن پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان و شوێنکەوتوانیانەوە ئاینی ئیسلام سەرکەوت بە سەر هەموو ئاینەکاندا ، بەڵام پاشان بارودۆخ گۆڕا و نەفامی باڵی کێشا بە سەر زۆربەی خەڵکیدا هەتاوەکو زۆربەی خەڵك گەڕانەوە بۆ ئاینی نەفامی و بت پەرستی بە ئەنجامدانی زیادەڕەوی لە ئاستی پێغەمبەران و پیاوچاکاندا به هاوار و بانگ لێکردنیان و داوای کۆمەکی کردن لێیان و چەندین شتی تر لە جۆرەکانی شیرك !

ئەمانە واتای ( لا إلـهَ إلاّ الله ) یان نەدەزانی وەکو کافرانی عەرەب دەیانزانی ! بەردەوام ئەم هاوبەش دانانە لە

ناو خەڵکیدا تەشەنەی دەکرد تاوەکو ئەم سەردەمەی خۆمان ، بە هۆی زاڵبوونی نەفامی و دوور کەوتنەوەمان لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ

شوبهەی ئەم موشریکانە هەمان شوبهەی ئەوانی پێشووە کە بریتی بوو لە ئایەتی : ﴿هَٰؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ ۝١٨﴾ [یونس] ، واتە : ئەمانە لای خوا تکاکارمانن ، وە ئایەتی : ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ ۝٣﴾ [الزمر]

واتە : ئێمە ئەوانە ناپەرستین مەگەر بۆ ئەوەی لە خوامان نزیک بکەنەوە

خوای گەورە لە قورئاندا ئەم شوبهەیەی پوچەڵ کردەوە و ڕوونی کردەوە هەر کەس جگە لە خوا کەسی تر بپەرستێ هەر کەسێ بێ ئەوە شیرك و کوفری بە خوای گەورە کردووە وەکو دەفەرموێ : ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ ۝١٨﴾ [یونس]

واتە : وە بێجگە لە خوا شتگەلێکی تر دەپەرستن کە نەزیانیان پێ ئەگەیەنن و نەسودێکیان پێ ئەدەن و ئەڵێن

ئەمانە لای خوا تکاکارمانن .

خـوای گـەورە بـەم ئایەتـە بەرپەرچـی داونەتـەوە کـە دەفـەرموێ : ﴿قُلْ أَتُنَبِّئُونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾﴾ [يونس]

واتە : بڵێ ئایا خەبەر بە خوا ئـەدەن دەربـارەی شـتێك کە لە ئاسمانەکان و زەویدا سەر و شوێنیان بۆ نی‌یە ؟! پاك و بێگەردی بۆ خوا لەو هاوبەشانەی کە دای ئەنێن .

خوای گەورە لەم چەند ئایەتەی پێشوودا ڕوونی کردەوە کـە پەرستنی غـەیری ئـەو لـە پێغەمبـەران و پیاوچـاکان و ئەوانی تر شیرکی گەورەیـە ئەگـەر چـی ئەنجامـدەرانی نـاوی تـری لێبنـێن ، خـوای گـەورە دەفـەرموێ : ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ﴿٣﴾﴾ [الزمر]

واتـە : وە کەسـانێ کـە غـەیری خوایـان بـە پەرسـتراو گرتووە ئەڵێن ئێمە ئەوانە ناپەرستین مەگـەر بـۆ ئـەوەی لـە خوامان نزیك بکەنەوە .

خوای گـەورە بەم ئایەتە بەرپەرچی داونەتەوە : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ

يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ۝٣﴾ [الزمر]

واتە : بەڕاستی خوا لەوەی کە جیاوازیان تێدا هەیە دادوەریان لە نێواندا دەکات بەڕاستی خوا ڕێنوێنی کەسانێ ناکات کە درۆزنی بێباوەڕ بێ .

خوای گەورە بەو ئایەتانە ڕوونی کردەوە کە پەرستنەکەیان بۆ جگە لە خوا بەپاڕانەوە ترس و تکا و ئەوانی تر ، کوفرە بە خوا ، وە بە درۆی خستنەوە لەو قسەیەی کە دەیان وت پەرستراوەکانمان لە خوامان نزیک دەکەنەوە .

لەو بیروباوەڕە کوفرانەی کە دژ بە بیروباوەڕی ڕاستەقینەن و پێچەوانەی ڕێبازی پێغەمبەرن ﷺ ، لەوانە :

* ئەو بیروباوەڕەی کە بێباوەڕ (مُلحد) ـەکانی ئەم سەردەمە هەیانە شوێنکەوتوانی مارکس و لینین و ئەوانی تر بانگەواز کارانی( إلحاد ) و کوفر ، ئەگەر چی ناوی لێبێنن سۆسیالیست یان شوعی یان بەعسی یان چەندین ناوی تر )

بنچینەی ئەو بیروباوەڕانە بریتی‌یە لە دروشمی ( **خوا نی‌یە و یان تەنها بریتی‌یە لە مادە** ) !!!

هەروەها لە بنچینەکانی تریان ئینکاری کردنی زیندوو بوونەوە و بەهەشت و ئاگری دۆزەخ و باوەڕ نەبوون بە ئاینە ئاسمانیەکان

بێگومان ئەوەی تەماشای کتێبەکانیان بکات و زمانی حاڵیان دیراسە بکات ئەو شتانەی بۆ دەر ئەکەوێت ، گومانیش لەوەدا نی‌یە کە ئەم بیروباوەڕە دژ بە هەموو ئاینە ئاسمانیەکانە و خاوەنەکەی لە دونیا و ڕۆژی دواییدا بۆ خراپترین دوا ئەنجام ئەبات

* لەو بیروباوەڕانە کە دژ بە بیروباوەڕی ڕاستەقینەن ئەوەیە کە هەندێ لە ( **باطینیة** )یەکان و هەندێ لە سۆفی‌یەکان هەیانە (کە هەندێ کەس لەوان پێی ئەڵێن ئەولیا) و باوەڕیان وایە هاوبەشن لە گەڵ خوادا لە بەڕێوەبردنی کاروباری جیهاندا و ناویان دەنێن : ( **أقطاب** ، **أوتاد** ، **أغواث** ) و چەندین ناوی تر کە خۆیان دایان هێناوە

بـــۆ پەرســـتراوەکانیان ، ئەمـــەش خـــراپترین شـــیرکە لـــە پـەروەردگارێتی خـوادا ، کـە خـراپترە لـە شـیرکی نـەفامی عـەرەب ، چـونکە کـافرانی عـەرەب ، لـە پەروەردگارێتیـدا شیرکیان ئەنجام نەدابوو ، بەڵکو تـەنها لەپەرستندا ، شیرك ئەنجامدانی ئەوان تەنها لە کاتی خۆشیدا بوو، بەڵام لە کاتی سەختیدا خوایان بە دڵسۆزی دەپەرست وەکو خـوای گـەورە دەفـەرموێ : ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ (٦٥) ﴾ [العنكبوت]

واتە : جا کاتێ سواری کەشتی بوون بە دڵسۆزی خـوای گـەورە بـانگ دەکـەن ، وە کـاتێ ئـەوانی بـردە وشـکایی و ڕزگاری کردن شەریکیان بڕیاردەدا .

بەڵام یەکتاپەرستی لە پەروەردگارێتی خوادا دانیان پێدا ئەنا وەکو خـوا دەفـەرموێ : ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ (٨٧) ﴾ [الزخرف] .

واتـە : وە ئەگـەر لەوانـە بپرسـی ئایـا چ کەسـێ ئـەوانی بەدی هێناوە بێ گومان دەڵێن خوا .

وە دەفەرموێ : ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ (٣١) ﴾ [یونس]

واتە : بلّێ چ کەسێ لە ئاسمان و زەویەوە ڕۆزیتان ئەدا ؟ وە یان چ کەسێ خاوەن و بەدیهێنەری گوێ و چاوانە ؟ وە چ کەسێ زیندوو لە مردوو یا مردوو لەزیندوو دەردێنێ؟ وە چ کەسێ تەکبیری کاروباری دونیا دەکات؟ دەڵێن خوا ، تۆش بلّێ ئەی بۆ لە خوا ناترسن و بەتەنها نایپەرستن .

وەچەندین ئایەتی تر لەم مەبستەدا هاتووە

*** موشریکەکانی ئەم سەردەمە لەوانەی کۆن زیاتریان کردووە ، ئەوەش لەدوو ڕوەوە :**

**یەکەم :** شیرکی هەندێکیان لە پەروەردگاریتیدا **( الربوبية )**

**دووەم :** شیرک کردیانیان لە هەردوو کاتی خۆشی وسەختیدا ، ئەوەی تێکەڵاوی کردبن هەواڵیانی زانیبێ و بینیبێتی چ دەکەن ئەم ڕاستیە دەزانی کە چی دەکەن لە

پەنای گۆڕی ئیمامی حوسەین و بەدەوریدا لە میصر ، وە لە پەنای گۆڕی (**عەیدەروس**)دا لە عەدەن ، وە (**هادي**) لە یەمەن ، وە (**ئیبنو عەرەبی**) لە شام ، و شێخ (**عبدالقادری گەیلانی**) لە عیراق ، وە چەندین گۆڕی بەناوبانگی تر کە خەڵکی سادە و عەوام زیادەڕەویان لە ئاستدا کردووە ، کە زۆربەی مافی خوایان بۆ ئەوان داناوە ! کەم کەسیش هەیە قەدەغەی ئەوەیان لێ بکات و یەکخواپەرستی ڕاستەقینەیان بۆ ڕوون بکاتەوە ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ !!!

داوا لە خوای پاك و بێگەرد دەکەین کە بیان گێڕێتەوە بۆ هۆش و ژیری خۆیان ، وە بانگەوازکاران لە نێوانیاندا زۆر کات و یارمەتی کاربەدەستانی موسڵمان و زانایانی موسڵمان بدات بۆ دژایەتی کردن و لە ناو بردنی ئەم شیرکە

* لەو بیروباوەڕانەی کە دژ بە بیروباوەڕی ڕاستەقینەن لەبەشی ناو و سیفەتەکانی خوادا بیروباوەڕی ئەهلی بیدعەیە، وەکو جەهمی‌یەکان و موعتزیلە و ئەوانەی کە ڕێگەی ئەوانیان گرتە بەر لە نەفی سیفەتەکانی خوای

گەورەدا ، و سیفەتەکانیان پەك خست و وەسفیان کرد بە نەبوو و سیفەتی ووشك و بێ مانا ! گەورەیی و بەرزی بۆ خوای گەورە لەو قسانەیان ، هەروەها ئەوانەش کە نەفی هەندێ لە سیفەتەکانی خوایان کرد و هەندێکی تریان سەلماند وەکو ئەشعەریەکان کە لەوانە دەژمێررێن ، چونکە سەلماندنی هەندێکی ئەوەیان لە سەر پێویست دەکات ئەوانەی تریش کە نەفیان کردووە و ماناکانیان گۆڕیوە بیان سەلمێنن .

ئەمانەش لەم کارەیاندا پێچەوانەی بەڵگەی نەقڵ و هەقڵیان کردووە ، و لەم مەسەلەیەدا کەوتوونەتە ناسزایی (**تناقض**)ێکی ڕوون و ئاشکراوە

بەڵام ئەهلی سوننە و جەماعە بە بێ کەموکوڕی ئەو ناو و سیفەتانەی خوا کە خوا بۆ خۆی دایناب‌ێ یان پێغەمبەر ﷺ دایناب‌ێ ، ئەمانیش سەلماندوویانە و دایان ناوە ، وە خوایان پاك ڕاگرتووە لەوەی بیشوبهێنن بە دروستکراوەکانی پاك ڕاگرتنێك دوور لە پەك خستنی سیفەتەکانی کەوابوو ئیشیان

بـە هـەموو بەڵگـەکان کـردووە ، نەدەسـتکاریان کـردووە و نەپەکیان خستووە ، تووشـی ئـەو ناسـزاییە نـەهاتوون کـە غەیری ئەوانی تێکەتووە وەکو باسمـان کـرد ، ئـەم ڕێگەیـە ڕێگـەی سـەرفراز بوونـە ، و خـۆش بـەختی دونیـا و ڕۆژی دواییە ، ئەمە ئەو ڕێگە ڕاستەیە کـە پێشین و پێشەوایانی ئـەم ئوممەتـە گرتوویانـە بـەر ، بەڕاسـتی پاشمـاوەی ئـەم ئوممەتە چاك نابێ مەگەر بەوەی کە پێشەکی پێ چاك بـووە ، کـە بیریتییـە لـە شـوێنکەوتنی قورئـان و سـوننەت و وازهێنانیان لەوەی پێچەوانەیان بووەستن .

## هەڵوەشێنەرەوەکانی موسڵمان بوون:

**برای موسڵمان**: پێویستە بزانی کە خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر هەموو بەندەکانی موسڵمان بن و دەست بگرن بە ئیسلامەوە و وریا بن لەوەی پێچەوانەی ئیسلامە وە پێغەمبەری ﷺ بۆ هەمان مەبەست ڕەوانە کردووە خوای گەورە هەواڵی پێداوین کە هەر کەسی شوێنی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بکەوێ ئەوە هیدایەتی وەرگرتووە و هەرکەسێکیش پشتی لێ هەڵکا ئەوە گومڕابووە.

وە لە چەندین ئایەتدا لە هۆکارەکانی پاشگەز بوونەوە و شیرك و کوفر وریامان دەکات، هەروەها زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ لە باسی حوکمی مورتەددا (هەڵگەڕاوە لە دین) باسیان کردووە کە موسڵمان بە چەندین هەڵوەشێنەرەوە لە ئیسلام دەردەچێ و ئەوانە خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەکەن، وە ترسناك ترین و ئەوەی کە زۆر ڕوو بدات، لەوانە ئەم دە (10) خاڵەن:

بە کورتی باسیان دەکەم لە گەڵ چەند ڕوون کردنەوەیەکدا لە کۆتاییاندا بۆ ئەوەی خۆت و خەڵکی تریش وریایان بن بە مەبەستی توش نەبوون و ڕزگاربوون لێیان:

**یەکەم :** هاوبەش بۆ خوادانان لە پەرستندا ، خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴿٤٨﴾ ﴾ [النساء].

واتە: خوای گەورە هەرگیز لەوە خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ بڕیار بدەی ، بەڵام لە هەموو تاوانێکی تر خۆش دەبێ بۆ هەر کەسێ کە خۆی بیوێ .

وە دەفەرموێ : ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾ ﴾ [المائدة]

واتە : بێگومان هەرکەسێ هاوبەش بۆ خوا دابنێ خوا بەهەشتی لێ حەرام دەکات و جێگای هەمیشەیی دۆزەخ دەبێ ، موشریکەکان لەوێدا هیچ کەس نییە پاڵپشتیان بێ وسەریان بخات .

لەجۆرەکانی هاوبەش دانان بۆ خوا وەکو بانگ کردن و داوا کردن لە مردووەکان و داوای کۆمەکی و نەزر و سەر بڕین بۆیان .

**دووەم :** هەر کەس لە نێوان خۆی و خوادا وایستە گەلێك

ئابنی و لییان بپاڕێتەوە و داوای شەفاعەتیان لێ بکات و پشتیان پی ببەستێ و ئەوە بە کۆڕای زانایان لە ئیسلام چووەتە دەرەوە

**سی یەم** هەرکەسێ موشریکەکان بە کافر نەزانێ یان گومانی ببی لە کافر بوونیان و ڕێبازەکەیان بە دروست بدات لە قەڵەم ئەوە کافر دەبێ

**چوارەم :** هەرکەسێ باوەڕی وابێ کە ڕێبازی یەکێکی تر جگە لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ تەواو ترە یان حوکمی یەکێکی تر لە حوکمی ئەو باشترە وەکو ئەوانەی حوکمی (**طاغوت**)ەکان لە حوکمی پێغەمبەر ﷺ بەچاکتر دەزانن ئەوەش کافر دەبێ

**پێنجەم :** هەرکەسێ رقی ببێ لە شتێك لەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی هاتووە ئەگەر کردەوەشی پێ بکات ئەوە کافر بووە ، لەبەر ئەم ئایەتە ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ۹ ﴾ [محمد]

واتە کردەوەی کافرەکان پووچەڵ بووەتەوە لەبەر

ئەوی کە ڕقیان بووە لەوەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە ـ قورئان بێ یان کتێبەکانی تر ـ بەو هۆیەوە کردەوەکانی پوچەڵ کردنەوە و لێی وەرنەگرتن.

**شەشەم:** هەر کەسێ گاڵتە بە شتێك لە ئاینی پێغەمبەر ﷺ یان لە پاداشت و تۆڵەی خوا بکات ئەوە کافر دەبێ ، بەڵگەش ئەم ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ۝٦٥ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ۝٦٦﴾ [التوبة] .

واتە : ئایا گاڵتە و لاقرتێ بە خوا و ئایەتەکانی و پێغەمبەرکەی ﷺ دەکەن ؟!! پاساو مەهێننەوە لە دوای ئەوەی باوەڕتان هێنابوو کافر بوونەوە .

**حەوتەم :** جادووکەر ( **السحر** ) وەکو دوور خستنەوە و لەیەك کردنی دڵی ژن و پیاو ( **الصرف** )[1] ، وە نزیك

[1] ( **الصرف** ) کارێکی جادووگەریە بەمەبەستی گۆڕانی دڵی ئینسان ئەنجام ئەدرێت لەوەی خۆشی دەوێت وەکو گۆڕینی کەسێك لە خۆشەویستی خێزانەکەیەوە بۆ ڕق لێ بوونی

کردنـەوەی دڵـی دوکـەس و دروسـت کـردنـی خۆشەویـستی لەنێوانیاندا ( **العطف** )[2]

هەرکەسێ جادوو گەری ئەنجام بدات یان پێی ڕازی بێت ئەوە کافر دەبی ، بەڵگەش ئـەم ئایەتەیـە کـە دەفـەرموێ

﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ﴾ [البقرة]

واتە: ئەو دوو فریشتەیەی کـە خـوا بـۆ تـاقی کردنەوەی خەڵك هێنابوونیە سەر زەوی هیچ کەسێکیان فێری جادوو نەدەکرد تا پێیان نەوتایە ئێمە لە لایەن خواوە نێردراوین جا خۆتان کافر مەکەن.

**هەشتەم:** پشتیوانی کردن و یارمەتی دانی موشریکەکان لە دژی موسڵمانان ، بەڵگەش ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ

﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [المائدة]

---

[2] ( **العطف** ) كارێكی جادووگەرییە بە مەبەستی خۆشەویست كردنی شت ئەنجام ئەدرێت كە خۆی خۆشی ناوێت بە چەندین ڕێگای ناشەرعی

واتە : هەرکەسێك پشتیوانی کافران بکات ئەوە لە گەڵ ئەوان حیسابی بۆ دەکرێت ، خوا هیدایەتی هۆزی کافران نادات .

**نۆیەم:** هەرکەسێ بیروباوەڕی وابێ کەسانێك هەن مەودایان هەیە و ڕێیان پێدراوە کە لە شەریعەتی ئیسلام دەر بچن و پەیڕەوی نەکەن ئەوە کافر دەبێت ، لە بەر ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ : ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ (٨٥) ﴾ [آل عمران]

واتە : هەرکەسێ جگە لە ئیسلام ئاینێکی تر هەڵبژێرێت لێی وەرناگیرێت ، وە لە ڕۆژی دواییدا لە خەسارەتمەندانە .

**دەیەم:** پشت کردن لەئاینی خوابەجۆرێ نەفێر ببێ نەکاری پێ بکات بەڵگەش ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ :

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَآ ۚ إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ (٢٢) ﴾ [السجدة]

واتە : کێ هەیە لەو کەسە ستەمکار تر بێت کە ئایەتەکانی خوای بۆ ڕوون بکرێتەوە لە پاش ئەوەش پشت هەڵ بکات بەڕاستی ئێمە تۆڵە لە تاوانباران دەسێنێتەوە.

ئەم خاڵانە باسکران هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان کەسێکدا بە گاڵتە بیان کات یان بە ئەنقەست یان لە ترساندا تەنها کەسێك نەبێت کە زۆری لی بکرێت

ئەم (10) دە خاڵە زۆر مەترسیان لێدەکرێت و زۆریش ڕوو دەدەن جا پێویستە مرۆڤی موسڵمان خۆی لێیان بپارێزێت و ترسی لەوە هەبێت نەوەکو تێبکەوێت

هەروەها ئەو کەسەی باوەڕی وابێ ئەو ڕیسا و یاسایانەی دروست کراوی دەستی مرۆڤن لە شەریعەتی ئیسلام باشترە ئەمەش دەچێتە ژێر خاڵی چوارەمەوە ، یان بیروباوەری وابی رژێمی ئیسلام لە سەدەی بیستەمدا بە کەڵکی تەتبیق و پەیڕەو کردن نایەت ، یان ئیسلام هۆکار بووە لە دواکەوتنی موسڵمانان ، یان ئیسلام لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوا دەرناچێ بۆ شتانی تر لە کاروباری ژیان ، هەروەها ئەو کەسەی باوەڕی وابی دەست بڕینی دز لە سزای دزی کردندا و ڕەجم کردنی پیاوی زیناکار و ژنی زیناکار کەژن و مێردیان هەبێ لە گەڵ ئەم سەردەمەدا ناگونجێ ،

هەروەها هەر کەسێ باوەڕی وابێ کە حوکم کردن بە جگە لە شەریعەتی ئیسلام دروستە با باوەڕیشی وانەبێ کە ئەوە لە ئیسلام باشترە ، چونکە لە بەر ئەوەی حوکم کردن بە جگە لە ئیسلام بە دروست دەزانێ ، کەوابوو حەرامێك کە کۆڕای زانایانی لە سەرە حەڵاڵی کردووە کەوابوو هەر کەسێ حەرامێك (کە لە ئیسلامدا زانراوبێ) حەڵاڵ بکات وەکو زینا و خواردنەوەی مەشروب و حوکم کردن بە غەیری ئیسلام ئەوە کافرە بە کۆڕای موسڵمانان ، پەنا بە خوا دەگرین لەو شتانەی دەبنە مایەی تووڕە بوونی خوا ، وە پەنای پێ دەگرین لە سزای سەختی .

وصلى الله على خير خلقه محمد وعلى آله وصحبه وسلم[1].

---

[1] ئامۆژگاری ... ێنەران دەکەین کەوا کتێبخانەکانیان دەوڵەمەند و بەهرەمەند بکەن بەم کتێبانە :

1 ـ گۆڤاری ڕێگای ڕاست ، (کە تا ژمارە پانزەی دەرچووە)

2 ـ زنجیرەی ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست ، (کە تا ژمارە شەستی لی دەرچووە)

3 ـ زنجیرەی بیروباوەڕی کۆمەڵی ڕزگار بوو و سەرکەوتوو ، (کە تا ژمارە سێی لێ دەرچووە)

4 ـ زنجیرەی ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا ، (کە تا ژمارە سێی لێ دەرچووە)

❁خوێنەری بەڕێز ئەگەر پرسیارێك یان پێشنیارێك یان تێبینییەکت هەبوو سەبارەت بەم بابەتە ، ئەوا پەیوەندی بکە بەم ژمارەیەوە: (07701580522)❁.

## وەرگێڕ
## مامۆستا خەلیل ئەحمەد

---

5 ـ زنجیرەی ئیسلام و لاوان (کە سێ ژمارەی لێ دەرچووە)

هەروەها چاوەڕوانی ژمارەکانی تری ئەم زنجیرەیە بن (زنجیرەی بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە) ـ لە ئامادە کردنی **مامۆستا خەلیل ئەحمەد** ـ کە بریتییە لەم کتێبانەی خوارەوە

1 ـ بیروباوەڕی ڕاستەقینە و دژەکانی 000 نووسینی / شێخ ابن باز 000 وەرگێڕان

2 ـ یەکخواپەرستی 000 نووسینی / شێخ محمد عبد الوهاب 000 شەرح

3 لابردنی شوبهەکان 000 نووسینی شێخ محمد عبدالوهاب 000 وەرگێڕان و لێکدانەوە ـ چاپ کراوە ـ

4 ـ عەقیدەی واسطی 000 نووسینی شێخی ئیسلام ابن تیمیة 000 شەرح و وەرگێڕان

5 ـ عەقیدەی [illegible] 000 نووسینی الطحاوي 000 شەرح

6 - الإبانة [illegible] نووسینی أبو الحسن الأشعري

